## پێشەکی

سەرتا سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای خاوەن زە مین

سوپاس بۆ هەموو ئەو دکتۆر وکارمەندە تەندروستیانەی کەڕۆژێك لە ڕۆژان پرسیارم لێ کردوون و بەدلێکی گەورە وەلامیان داومەتەوە ئەو کەسانەی کەمێکیش بێ یارمەتیان داوم جێگەی ڕێزو تەقدیرە لەلای من .

ئامانج لە دروست کردنی ئەم کتێبە ئاشنابونی قوتابی و فێرخوازە بە دەرمانەکان و چۆنیەتی مامەلەکردن لەگەل بارەکان

لە م کتێبە باسی گرووپاتی دەرمان و چۆنیەتی بەکارهێنانیان کراوە
هەروەها باسی هەندێ نەخۆشی کراوە کە لە ژیانی ڕۆژانەماندا گوێمان لێ دەبێ

هەروەها هەندێ گرووپ تەنها بۆ ئاشنا بوون پێی دام ناوە ئەو گرووپانە تەنیا دکتۆر دەبێ بۆ نە خۆشی بنوسێ
نمونە وەك( پەستانی خوێن وشەکرە٠٠٠٠)-

- بۆ هەر ڕەخنە و پێشنیارێك سوپاستان دەکەم

Prepared by-
Mohammad Rajab Muhamadamin
Gimail
mohammedrajeb230@gmail.com

{بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ}

(١) الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٢) الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (٣) مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ (٤) إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (٥) اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ (٦)صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ (٧)} [الفاتحة]

**(بە ناوی ئەو خوایەی کانگای ڕەحمەت و سۆزو بەزەییە).**

(١) سوپاس و ستایش هەر شایستەی خوایە و بۆ خوایە، کە خاوەن و پەروەردگاری هەموو جیهانیان و هەموو بوونەوەرە. (٢)

بەخشندەی میهرەبان، کانگای ڕەحمەت و میهرەبانییە (ڕەحمەتی لە دنیادا هەموو شتێکی گرتوتەوە، بەڵام لە قیامەتدا تەنها بۆ ئیماندارانە). (٣)

خاوەن و سەرداری ڕۆژی پاداشت و سزایە (پادشای ڕۆژی قیامەتە کە دادپەروەری ڕەهاو بێ سنووری تێدا بەرپا دەکات). (٤)

خوایە، تەنها هەر تۆ دەپەرستین و هەر لەتۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین (لە کاروباری دین و دنیاماندا، بەکەسی تر لە بەدەکانت ناکرێت). (٥)

خوایە بەردەوام ڕێنمووییمان بفەرموو بۆ ئەم ڕێبازی ڕاست و دروستی ئیسلامە. (٦)

کە بەرنامە و ڕێبازی ئەوانەیە لە نازو نیعمەتی خۆت بەهرەوەرت کردوون، نەمانخەیتە سەر ڕێبازی ئەوانەی خەشم و قینیان لێگیراوە (بەهۆی ئەوەوە دەیزانن و لایانداوە)، هەروەها نەمانخاتە سەر ڕێبازی ئەوانەش، کە سەرگەردان و گومڕان (بەهۆی لاساری و یاخی بوون و نەزانینیانەوە) (٧)

ابن القیم { دەربارەی سورەتی فاتیحە } دەڵێت ــــــــــ

سورەتی فاتیحە دوو جۆر شیفا لە خۆ دەگرێ
١ ــ شیفایە بۆ دڵ
٢ ــ شیفایە بۆ جەستە

# ئازار شكێنەكانAnalgesics

یەكەم گرووپ كە كۆمەڵەی ئازار و دژە هەو كردنە
ئەم هەوكردنە لە ڕێگەی بەركەوتن بە تەنێك كە بووبێتە هۆی هەڵئاوسان وسوربونەوە ، واتە لە ڕێگەی ڤایرۆس و بەكتریا نەبووبێ ٠ دەبن بە دوو كۆمەڵە٠



## کۆمەڵەی یەکەم non-narcotic analgesic

ئەم دەرمانانە لەکاتی هەبونی( ژان لەسەر،ئازاری ماسولکە ،ئازارێك بەهۆی هەوکردنەوەبێ) دەدرێت بە نەخۆش.

- paracetamol - panadol – doliprane( 1*3 )( 1*4)
- meloxicam – mobic (1*1)
- tenoxicam -telcotil (1*1)
- -peroxicam – feldene (1*1)
- ibuprofen-doloraz (1*2)
- ketoprofen (1*2)
- diclofenac sodium-olfen – voltaren (1*2)
- diclofenac potassium- voltfast (1*2)
- indomethacin -indocin (1*3)
- naproxen -no pain (1*2)
- Ketalgin-(IM)
- celecoxib -celebrex (1*1) ( 1*2)
- etoricoxib -arcoxia (1*1)
- fenoprofen – nalfon
- acetyl salicylic acid (aspirin) over dose

(100mg وەک خوێن شل کەرەوە)
(300mg وەک ئازارشکێن)

بۆ کێ بەکار نایەت

- ئەو کەسانەی بەرزی پەستانیان هەیە دیکلۆ فیناك سۆدیۆم نا بێ بەکار بێنێ.
- حەساسیەت بەو گرووپە .
- ئاگادار بە ئەوکەسانەی نەخۆشی جگەریان هەیە پاراسیتۆل بەکار مەهێنە .

تێبینی / سەلامەترین دەرمان لەم کۆمەلەیە بۆ ئافرەتی دووگیان پاراسیتۆلە .
تئبینی / باشترین ئازار شکێن بۆ سوڕی مانگانە پرۆفینە و پۆنستان .

## کۆمەڵەی دووەم narcotic analgesic

ئەم کۆمەلە بەکاردێن بۆ ئازاری زۆر بەهێز وەك( شکان و سوتان و ژانی گورچیلە).

- morphine
- Codine
- Tramadol

- بەبێ ڕاچێتە مەدە بە نەخۆش ، چونکە زۆر بەکار هێنانی وا لە نەخۆش دەکا ئالودەبێ پێیەوە.

## دژه بەکتریاAnti biotics

گرووپی دژه هەوکردن ئەو جۆره هەو کردنانەی بەهۆی بەکتریا یەوەیە وەك هەوکردنی ( جیوب و پێست وبۆڕی میز و گوێ و چاو)٠

کۆمەلەکانی ئەم گرووپە



**کۆمەڵەی یەکەم penicillins**

بەکاردێن دژی هەوکردنی گوێ و لووت و قوڕگ و پێست و ڕێرەوی میز و بەشی خوارەوەی ڕێرەوی هەناسە و بەکتریای گەدە بەکاردێت٠

- amoxicillin – amox (1*3)
- ampicillin-omnipen (1*3)
- pencillin V.
- pencillin G (1*1 IM)
- pipercillin
- ampiclox (cloxacillin + ampicillin). (1*3 )
- (Augmenten. (amoxicillin + clavulanic acid) (1*2)

- سەلامەتترین دەرمانە لەم گرووپە بۆ ئافرەتی دووگیان(amoxicillin)

**کۆمەڵەی دووەم cephalosporins**

ــ بەکاردێن بۆ هەوکردنی لەوزەتێن ، ڕێرەوی هەناسە ، ڕێرەوی بۆڕی میز ، هەوکردنی میزڵدان ، هەوکردنی پیست ، گورچیلە.

- cefixime – suprax (1*1)
- cefalexin -keflex (1*3)
- cefuroxime (1*3)
- cefidiner( 1*2)
- ceftriaxone (1*2 )
- Cefotaxime (1*2 )

١ــ دەبێ تێستی هەستیاری بۆ بکرێ ٠
٢ــ نابێ لەگەر شیر و مادە ئاسنیەکان بخورێ
یان دەبێ دووکات ژمێر بەینیان هەبێت٠

**کۆمەڵەی سێیەم fluoroquinolons**

بەکاردێن بۆ هەوکردنی پرۆستات ، سکچون بەهۆی بەکتریا ، پێست ، ڕێرەوی هەناسە ، میزڵدان ، جیوب ، حمە ماڵتا ، گراناتا ، ئیسك.

- -levofloxacin( 1*1)
- ciprofloxacin - bactiflox - ciprodar (1*2 )
- moxifloxacin (1*1 )
- norfloxacin (1*1)
- Ofloxacin (1*1)

**كۆمەڵەی چوارەم macrolides**

بەکاردێن بۆ هەوکردنی پێست ، هەوکردنی ڕێڕەوی هەناسە ، زیپکە ، سکچون ، بەکتریا H.paylori ، هەکردنی لەوزەتێن .

- ➢ azithromaycin ( 1*1)
- ➢ calrithromaycin (1*2)
- ➢ erythromaycin ( 1*2)
- ➢ spiramycin

- ئاگادار بە لە کاتی پێدانی azithromaycin چۆن بەکار بهێنێت پێ بڵێ ڕۆژی یەک جار یەک سەعات پێش نان یان دوو سەعات پاش نان .
- ئەوانەی نەخۆشی پاقلەیان هەیە نابێ ئەم دەرمانە بەکار بێنن spiramycin
- erythromycin gel بۆ زیپکە بەکار دێت .

**كۆمەڵەی پێنچەم aminoglycosides**

بەکاردێن بۆ هەوکردنی پێست ، هەوکردنی میزەڕۆ ، نەخۆشی کۆ ئەندامی هەناسە ، هەوکردنی کۆ ئەندامی هەرس ، گراناتا

- ➢ tobramycin (1*2)
- ➢ gentamycin (1*2)
- ➢ amikacin (1*2 )
- ➢ streptomycin (1*2)

- دەرمانەکانی ئەم کۆمەلە بە مغەزی دەبێ بۆماوەی ٣٠ خولەك بدرێ بە نەخۆش ٠

**شەشەم carbapenems**

کە لە چەند دەرمانێک پێک دێن بە گشتی بەکاردێن بۆ هەوکردنی زۆربەی بەکتریاکان هەوکردنی کۆئەندامی میز و میزەڕۆ ، هەوکردنی کۆ ئەندامی هەناسە ، هەوکردنی پێست و جومگە ، هەوکردنی ماسولکەکانی دڵ .

- ➢ imipenem
- ➢ meropenem( 1*2)

- ئەمانە تەنها بە شێوەی دەرزی هەیە .

## حەوتەم کۆمەڵەی Teracyclines

بەکاردێن بۆ هەوکردنی زێی ئافرەتان و زیپکە و هەوکردنی گەدەو ڕیخۆڵە و هەڵئاوسانی چاو .

- ➢ Tetracycline (1 * 2)
- ➢ Doxycycline( 1 * 2)

- ▪ واباشترە نەخۆش نەچێتە بەر تیشکی خۆر ئەگەر چوو دژە ڕۆژ بەکار بێنێ
- ▪ ئەم دوو دەرمانە لەگەڵ کالسیوم وەرمەگرە وا باشە لە کاتی نانی نیوەڕۆ بخورێ ، بەیانیان باش نییە چونکە زۆربەی خواردنەکانی بەیانیان کالسیومی تیدایە وەک ماست و شیر و پەنیر ..هتد بەرهەمە شیرەمەنیەکان.

Target processes that differ between bacteria and human cells

- Cell Wall Synthesis
  beta-lactams, vancomycin
- Protein Synthesis
  aminoglycosides, tetracyclines, chloramphenicol, macrolides
- Nucleic Acid Synthesis
  quinolones, metronidazole, rifampici
- Cell Membrane
  polymyxins
- Metabolism
  sulfonamides, trimethoprim




Bactericidal drugs kill bacteria
Bacteriostatic drugs stop bacterial growth

## خاوکەرەوەی ماسولکه skeletal muscle relaxants

دەرمانەکانی ئەم گروپە بەکار دێ بۆ ئازاری ماسولکه ، تا ، ئازاری گشتی لەش بەکار دێن .
دەرمانەکان زیاتر لە مادەیێک پێکهاتوون .

- (chlorzoxazone + paracetamol)-Paraxone – relaxone( 1 * 3) (  1*4)
- (orphenadrine + paracetamol) Norgesic - myogesic ( 1 *3)( 1 * 4)
- Tolpiresone (1*3)
- Baclofen (1*3)

- وا باشە زۆر بەکار نەهێنرێت کاتی پێویست زۆر باشە .
- ئەوکەسانەی نەخۆشی دلیان هەیە دەبێ بەوریایەوە بەکاری بێنن



# anti histamine

ئەنتی هیستامین پۆلێک لە دەرمانەکانن کە بە شێوەیەکی ئاسایی بەکاردەهێنرێن بۆ چارەسەرکردنی نیشانەکانی حەساسی. لە ڕێگەی کەمکردنەوە یان بلۆککردنی هیستامین، ئەمەش وادەکات نیشانەکان ڕابگرێت.

**هەستیاری چیە ؟** کاتێك ڕوودەدات کە سیستەمی بەرگری جەستە وەلامدانەوەی هەبێ بۆ تەنێکی نامۆ کە دێتە ناو جەستە وەك(تۆز ، ژەهری هەنگ ،خواردنێك کە پێی نەکەوێ)ە

**نیشانەکانی هەستیاری :**پەیوەندی هەیە بەو مادەیەی کە توشی هەستیاریت دەکات بەپێی شوێنەکەی جیاواز

هەستیارڕێڕەوی هەوا( پژمە ، ئاوی لوت ، ئاوی چاو ، سوربونەوەی ، خوران) -
هەستیاری بە دەرمان( خوران ، لیرك ، ئاوسانی پێست)-
هەستیاری بە مێرووله( دروستبونی بلقی گەورە لە شوێنی پێوەدان ، خوران و سوربونەوە) -

گروپی دەرمانەکانی antihistamin دەبن بە دوو کۆمەڵە

## Classification of antihistaminics

**First Generation**
- Diphenhydramine
- Dimenhydrinate
- Doxylamine
- Promethazine
- Hydroxyzine
- Pheniramine
- Cyroheptadine
- Meclizine
- Chlorpheniramine
- Dexchlorpheniramine

**Second Generation**
- Cetirizine
- Levocetirizine
- Fexofenadine
- Loratidine
- Desloratidine
- Ebastine
- Astemizole
- Acrivastine

.

**کۆمەڵەی_یەکەم** : ئەم کۆمەڵەیە خەو هێنەرن ، بەڵام کۆمەڵەی دووەم نابێتە هۆی خەو لێ کەوتن .
هەردووک کۆمەڵەش بەکاردێن بۆ حەساسیەی لوت و قورگ ، حەساسیەی وەرزی ، حەساسیەی پێست خوران ،لیر، ئاوی لوت ، حەساسیەی چاو ... هتد

- chlorphenaramine- allermine
- diphenhydramine
- dimehydrinate
- clemastine
- cyproheptadine
- pezotifen - Rouza
- ketotifen
- cinarizine- stugerun
- hydroxyzine















**کۆمەڵەی دووەم** : لە چەند دەرمانێک پێک هاتوون بریتین

- loratadine - lortin - restamine
- desloratadine
- fexofenadine
- cetirizine
- levocetirizine

- دەرمانەکانی ئەو گروپە بە شەو پێش خەوتن بەکار دێن .
- (Loratadine وfexofenadine )بۆ کەسێک بەکار نایەت پەستانی خوێنی هەبێت









# corticosteroids

ئەم دەرمانانەبەکاردێن بۆ (هەوکردن ، حەساسیە ، برینی ناو دەم ، ئەگزیما ، تەنگە نەفەسی ، مایەسیری ، کۆخە ، گەشەی ناتەواوی سی ئەو منداڵانەی کە لە دایک نەبوونە) .

- dexamethasone -dexon – decadron( 1*2)( 1*3)
- betamethasone (1*2)( 1*3)
- Beclomethasone.( 1* 2)
- clobetasole cream (1*2)
- mometasone – cream( 1*1)
- HaydroCortisone (1*2)( 1*3 )
- Prednisone( 1 *2)( 1*3)

- ئەم دەرمانانە بۆ ماوەیەکی درێژ نابێ بەکار بێ ٠
- هەندێ کەس (دێکزا) بەمەبەستی قەڵەو بون بەکاردێنن بەلام ئەمە بۆچونێکی هەڵەیە٠












## Gastrointestinal drugs

ئەم گروپە پێك دێ لە چەند كۆمەڵەیەک كە هەریەكەو بۆ مەبەستێك كار دەكات٠



## کۆمەڵەی1 proton pump inhibitor (ppi)

دەرمانەکانی ئەم کۆمەڵەیە کار دەکەن بۆ ئەوەی H+ لە گەڵ Cl یەک نەگرن ، چونکە بە یەک گرتنی Hcl ترشی هایدرۆکلۆریک دروست دەبێ لە گەدە .

دەرمانەکانی ئەم گروپە بەکاردێن بۆ کەمکردەنوەی ترشی گەدە ، برینی گەدە ، دڵە کزە ، GERD گەڕانەوە ترشێتی بۆ سورێنچک ، چارەسەری H.Pylori .

- omeprazole (1*1)( 1*2)
- esomeprazole – nexium(1*1)
- pantoprazole (1*1)
- Lansoprazole (1*1)
- Rabeprazole (1*1)

- دەرمانەکانی ئەم گرووپە نیو سەعات یان یەک سەعات پێش نان بە گەدەی بەتاڵ دەخورێن( ١*١ یان ١*٢ )، جگە لە (Rabeprazole ) کە دەتوانرێ پێش نان و پاش نان بخورێ٠












## کۆمەڵەی ٢ H2 receptor blocker

دەرمانەکانی ئەم کۆمەڵەیە H2 بلۆک دەکەن .
بەکاردێن بۆ چارەسەری ئەوانەی برینی گەدەیان هەیە ، کەم کردنەوەی ترشێتی گەدە ، گەڕانەوەی ترشەڵۆکی گەدە بۆ سورێنچک GERD ، دڵە کزە .

- Ranitidine-zanntac (1*2)
- famotidine (1*2)
- cimitidine (1*2)

- ئەگەر (١*١ )بوو پێی بڵێ شەوان پێش خەوتن بخۆ ، ئەگەر( ١*٢) پێی بڵێ ڕۆژی دوو جار نیو سەعات پێش نان بخۆ.









## کۆمەڵەی anti spasmodic drugs

بەکار دێن هەوکردنی گەدە ، ئازاری سک ، گرژ بوونی کۆڵۆن برینی دوانزەگرێ ، چارەسەری غازات .

- Librax – (1*3)
- hyocine butayle bromide-buscopan (1*3)
- mebeverine -dupatalin - colospasmin forte(1*2)
- colona(1*2)
- otilonium bromide- spasmomen(1*2)
  - ئەو دەرمانانە نیو سەعات پێش نان دەبی بخورێن












**کۆمەڵەی anti-acid**

کەم کردنەوەی ترشێتی گەدە ، GERD ، دڵە کزە ، ئازاری گەدە .

- Ca CO3 + MgCO3–(-**Rennie** )
- Sodium alginae + NaCO3 + CaCO3—-**(gaviscon)**
- Al(OH)3 + Mg(OH)2—-(**maalox**)
- Al(OH)3 + Mg(OH)2 + Dimethicone—— **(maalox plus)**

- بەکار هێنانی دەبێ نیو سەعات تا یەک سەعات پاش نان بخورێ شەوانیش پێش خەوتن
- واتە (۱* ٤ )، ئەگەر کاتی پێویستیش بێ زۆر باشە ئاسایە بەکار بهێنێت .









## کۆمەڵەی anti vomiting

ئەم دەرمانانە بەکاردێن بۆ ڕشانەوەو دلتێکهەلچون ٠

ڕشانەوە ٠ بریتیە لە کۆنترۆل نەکردن و نە هێشتنەوەی ئەو پێکهاتانەی لەناو گەدەدایە وە هاتنەدەرەوەیان لەڕێگەی دەمەوە٠

**هۆکارەکانی**

١ــ ڤایرۆس
٢ــ بەکتریا
٣ــ مشەخۆر
٤ــ کاریگەری لاوەکی هەندێ دەرمان
٥ــ خۆراکی پیس

- domperidone – motilium (1*3)
- metoclopramide -plasil (1*4)
- clorpromazine - largectil (1*4)
- Ondansetron - zofran - NO_VOMIT
- prochlorperazine -stemtil (1*3)
- (meclozine + B6 pyridoxine) -vominore  (1*2)
- cinarizine -stugeron

- دەرمانی ڕشانەوە نیو سەعات پێش نان دەخورێت .
- **Vominore**و **cinarizine**بۆ ئەو کەسانەی لەسەفەر توشی ڕشانەوە و دل هەلچون دەبن کاتژمێریك پێش سەفەر دەبێ بەکاربێ٠















**کۆمەڵەی Diarrhoea**

بەکار دێن بۆ سکچوون .

سکچوون / یەکێکە لەو نەخۆشی و کێشە تەندروستی یانەی توشی منداڵان و کەسانی پێگەیشتوو دەبێت لە هەموو وەرزەکاندا بە گشتی و لە وەرزی گەرمادا بە تایبەتی. بریتی یە لە شلبونەوەی پاشەڕۆ زیاتر لە ٣ جار لە ڕۆژێکدا.هەندێکجار زۆر زیاتریش دەبێت و ماوەی چەند ڕۆژێك تا چەند هەفتەیەك بەردەوام دەبێت.و دەبێتە هۆی ووشکبونەوەی جەستە بەگشتی و پێست بە تایبەتی بەهۆی لەدەستدانی بڕێکی زۆر لە ئاو و شلەکانی لەش .
سکچوون بە هۆی بەکتریا ، و ڤایرۆس ، و مشەخۆریشەوە دەگوێزرێتەوە لە ڕێگەی خۆراك و ئاوی پیسەوە،

- (atropine + diphenoxylate) - entero_stop (1*4)
- loperamide
- bio lact sachet
- Tasectan sachet
- metronidazole-> flagyel ڕاستەوخۆ ٢حەب دەخوا ئەگەر هۆکارەکەی بەکتریابێ
- Diastop suspension
- Zinc syrup بۆ سکچونی منداڵان

- (bio lact sachet) زیاتر بۆ منداڵە زۆر زۆر باشە بۆ منداڵێ ساوا تا ٢ ساڵی ڕۆژی یەک ساچێت لە ناو شیر دەکەی دەیدێی .
- بۆ منداڵی سەروی ٢ ساڵ ڕۆژێ دوو جار ناو ئاویش بێت ئاسایە .
- دیاستۆپ بۆ سکچونی بەهێز و سکچونی هاوینە بەکار دێت بۆ منداڵی ساوا تا ٢ ساڵی ١ ملاک چایە ڕۆژی ٣ جار، بۆ منداڵی سەرووی ٢ ساڵی تا ٥ ساڵ ٢ ملاکی چایە ڕۆژی ٣ جار .









## کۆمەڵەی constipation

بریتیە لە دەرنەچونی پیسایی ، بۆ ماوەیەك زیاتر بێ لە سێ ڕۆژ یان دەرچونی پیسایی ڕەق و وشك ،کردنی فشارێکی زۆر و هەبونی ئازار٠

<u>هۆکارەکانی</u>

١ــ خواردنی ناهاوسەنگ کەم خوارنی سەوزە و ڕیشاڵەکان
٢ــ تەمبەڵی و نەجولان
٣ــ هەڵکشانی تەمەن
٤ــ تێکچونی هۆڕمۆن

- biscodyle - dulcolax
  - ئەم جۆرە نابێ بەردەوام بەکاربێ چونکە دەبێتە هۆی تەم بەڵ بونی کۆڵۆن٠
- senade
- lactulose -duphlac بۆ کەسێک نابێ شەکرەی هەبێ
- ispaghul husk - fabyogel
- castor oil
  - بەهیچ شێوەیەك نابێ ئافرەتی دووگیان بەکاری بێنێ٠
- movicol sachet
- Eucarbon
- laxo dep
  - ئەو گروپە دەرمانەکانیان پاش نان بەکار دێن












## گروپی flatulence

بەکار دێن بۆ غازات

هەڵئاوسانی سك یەكێكە لە گرفتە باوەكان دیارە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ كۆمەڵێك هۆكار ، یەكێك لەو هۆكارانە دیارە كۆبونەوەی غازاتێكی زۆرە لە گەدە و ڕیخۆڵە وە ئازارێك توندیشی لەگەر دایە ٠

<u>خۆپارێزی</u>

١ــ دووركەوتنەوە لە خواردنە گازیەكان
٢ــ دووركەوتنەوە لە خواردنی پیاز و تور
٣ــ دوركەوتنەوە لە جگەرە و نێرگەلە
٤ــ دووركەوتنەوە لە خواردنی چەورر

- simethicone - Disflatyl
- Gas dep
- Gas off
- Eucarbon
- Colic EZ drop
- kids 0-9 colic drop
- Bonnisan

- حەبەكان پاش نان بەكار دێن ، كاتی پێویست یان ڕۆژی ٣ جار.
- colic EZ و kids 0-9 ڕۆژی چوار جار دەدرێت بە منداڵ ١٥ خولەک پێش شێردان .
- -منداڵی خوار ٦ مانگ ١٠ قەترە .
- -منداڵی ٦ ـ ١٢ مانگ ١٥ قەترە .
- -منداڵی سەرووی ١٢ مانگ ٢٠ قەترە.
- 1ml = 20 drop











Mohamad Rajab muhamadamin

# دژە کەڕووAnti fungal

گرووپی دەرمانەکانی دژە کەڕوو

دەرمانەکانی ئەم گرووپە بەکار دێن بۆ کەڕووی نێوان پەنچەکانی قاچ ، کەڕووی نینۆک ، کەڕووی زێ ، کەڕووی پێست ، کەڕووی ناو دەم ، کەڕووی سەر .

- Naystatin بۆ سوتانەوە باشە
- fluconazole
- clotrimazole _canesten - candistan
- miconazole –daktarin
- terbinafine –corbinal
- itraconazole
- sertaconazole
- isoconazole
- (metronidazole + miconazole) –Ovumix
- (isoconazole + diflucortolone)–Vocort

- naystatin drop بۆ فتریاتی ناو دەم بەکار دێت ڕۆژی ٤ جار ١مل بۆ گەورە ، ٠.٥ مل بۆ منداڵ پاش نان
- کرێمەکان و مەلحەمەکان بۆ پێست ڕۆژی( ٢ - ٣ )جار بەکار دێن .
- شامپۆ بۆ فتریاتی سەر هەیە کە بە کارت هێنا دەبێت ٥ خولەک بۆ ١٠ خولەک بە سەرتەوە بمێنێ٠









# دژە ڤایرۆسAnti viral

دژە ڤایرۆس دەرمانەکانی ئەم گروپە بەکار دێن بۆ هەوکردنێک هۆکارەکەی ڤایرۆس بێت وەک تامیسکی لێو و زێ و مێکوتە (سۆریکە) هەر هەوکردنێک بێ نیشانەکانی ڤایرۆس سوربونەوەو خوران .

- acyclovir – zovirax – veramid
- valaciclover
- famciclovir
- valganciclovir

- دەتوانی acyclovir بدەی بە نەخۆش ڕۆژی(4 تا ٥ )جار بەکار بهێنێت . بەلام کرێمەکەی دەتوانی زیاتر بەکاری بهێنی ٠









# دژە کرمAnti helminthic

بەکار دێن بۆ لە ناو بردنی زۆربەی کرمەکان و مشەخۆرەکان.
نیشانەکانی بوونی کرم..      (گەڕ شەی خراپ و بێ تاقەتی و کەم خوێنی  وپەڵەی پێست و ژانی سك و جولەی مندال لەکاتی خەو)

➢ Albendazole _ alzental 200 mg & 400  mg

- ئەم جۆرەیان بەیەك ڕۆژ دەخورێ و پاش سێ ڕۆژی ئینجا پاکەتی دووەم ٠




➢ mebendazol -vermox 100 mg

- ئەو مندالانەی کە کرمیان هەیە هەرکام لەمانەی بدەی کێشەی نیە ٠
- سێ ڕۆژ لەسەر یەك بەکاری دێنێ ڕۆژی ١٠ مل ٠
- دوای ئەوە هەفتەی داهاتوو لە هەمان ڕۆژ پێی بدەوە هەمان جورعە ٠



## هەلامەتCold and flu

دەرمانەکانی ئەم کۆمەڵەیە بەکاردێن بۆ هەلامەتی وەرزی ٠

- flu out
- rinoraz
- panadol flu
- A_ferin
- Rhumix
- piodol Cold & flu
- parazar flu day & night
- coldin
- Congestal

- دەتوانرێ ڕۆژێ (٣ - ٤ )جار بەکار دەێن .












## جۆرەکانی شروبی عێراقی سامراء کۆمەڵێ شروبن لە دەرمانخانەکان هەیە

(ANTI PYROL --)بەکاردێت بـــۆ کەم کردنەوەی پلەی گەرمی لەش .
(SOLVODIN )-بەکاردێت بـــۆ کۆخەی تەڕ ٠
(ALERMEEN) -بەکاردێت بـــۆ هەستیاری ٠
(TUSSILET )-بەکاردێت بـــۆ کۆخەی منداڵان .
(COLDIN) -بەکاردێت بـــۆ هەڵامەت و سەرمابوون و ئەنفلۆنزا .
(DEXON) -بەکاردێت بـــۆ هەستیاری و هەوکردنی بۆڕی هەناسە .
(SAMILIN )-بەکاردێت بـــۆ کۆخەی تەڕ ٠



## هەندێك مەرهەمی عێراقی كە لە دەرمان خانەكان هەن

(Nystacort) بەکاردێت بۆ : دژە کەڕوو، حەساسیە.
(zinc oxide) ☹ بەکاردێت بۆ : پەڵەی پێست، نەرمکردنی پێست، سووتان و سووتانەوە.
(Dermocal cream) بەکاردێت بۆ : حەساسییەتی پێست، نەرمکردنی پێست، سووتانی پێست بە خۆر، مێکوتە، وشکەبیرۆ.
(hydrocortisone) بەکاردێت بۆ : حەساسییەتی پێست.
(whitefield) : بەکاردێت بۆ : قلیشانی دەست و پێ، تەنکردنەوەی پێست، حەساسیە.
(Betnosam) : بەکاردێت بۆ : حەساسییەتی پیست، هەوکردنی پێست.



# بەرزە پەستانAnti hypertension

**بەرزە پەستانی خوێن چییە ؟**

بەرزبونەوەی پەستانی خوێن بریتییەلە ڕێژەی بەرزی پەستانی خوێن لە رێژەی ئاسایی خۆی لەناو دەمارەکانی خوێندا ئەمەش بە ئامێری پەستانی خوێن دەپێورێت.

**نیشانەکان:**

هەندێك کات نەخۆش بۆ ماوەیەك هیچ نیشانەیەکی نیە، هەندێك جاریش کەسەکە توشی سەر ئێشەیەك دەبێت لە بەشی دواوەی سەری بەتایبەت لە سەرەتای رۆژداو پاشان بە هۆی کارکردنی رۆژانەیەوە نامێنێت.

**هۆکارەکان:**

١ــ هۆکارە بۆماوەییەکان، واتە چەند کەسێك لەو خێزانە بە هۆکاری بۆ ماوەی تووشی بەرزبونەوەی پەستانی خوێن دەبن.
٢-بەرزبونەوەی پەستانی خوێن بە هۆی بوونی کێشەوە لە بەشێکی جەستەدا وەك ( نەخۆشییەکانی گورچیلە، بەکارهێنانی هەندێك جۆری دەرمان، مادده کهولیەکان، نەخۆشی غودەکان ).
٣-قەڵەوی و وەرزش نەکردن.
٤-زۆر خواردنەوەی مادده کهولیەکان.
٥-زۆر بەکارهێنانی خوێ.
٦-جگەرە کێشان.
٧-خواردنی ئەسپرین.
٨-نزمی ئاستی پۆتاسیۆم لە خواردندا.



**ئەمانەش دەبن بە چەند کۆمەڵەیەك**

**Diuretic**

ئەم جۆرە دەرمانانە بەکاردێ بۆ نزمبونی پەستانی خوێن

- Hydroclorothaiazde
- Furosemide
- Amiloride
- Chlorothaizide
- Sprinolactone

**Beta blocker**

بەکاردێن بۆ بەرزی پەستان و شەقیقە و دلە ڕاوکێ

- Propranolol
- Carvidilol
- Atenolol
- Metoprolol
- Penbutolol
- Bisoprolol

**Calcium channel bloker**

بەکار دێن بۆدابەزینی پەستانی خوێن و ئازاری سنگ و ناڕێکی لێدانی دڵ

- Amlodipin
- Nifedipine
- Filodipin
- Diltiazem
- Varapamil

**ACE Inhabitor**

بەکاریٚ بۆ بەرزە پاستانی خوێن و پەکەوتنی دڵ
تێبینی //ئەو کاریگەریەی ئەم دەرمانانە دروستی دەکەن زیاتر( کۆخەی وشکە) -

- Captopril
- Enalapril
- Lisnopril
- Fosinopril

**receptor blokerIIAngiotensin**

بەکاردیٚ بۆ نزمبونی پەستانی خوێن و پەکەوتنی دڵ

- Candesartan
- Irbesartan
- Losartan
- Valsartan
- Tilmesartan
- Eprosartan

بەکارهێنانی دەرمانەکانی بەرزە پەستان دەبیٚ لە ژێر چاودێری دکتۆری پسپۆربیٚ٠

# دژە چەوری Anti hyperlipidemia

**چەوری چیە ؟** لە ناو خوێنی هەموو کەسێك جۆرە مادەیەك هەیە کە شێوەی وەك و ڕۆنە پێی دەوترێ چەوری بونیان پێویستە ،چونکە بەشدارە لە کۆمەڵێك کارلێکی پێویست ، وەك هەلگرتنی خۆراك و وزە و گەیاندنیان بە شانەکان ٠

**جۆرەکانی چەوری ناو خوێن چین ؟**

**یەکەمیان چەوری جۆری" HDL"** کە بەکۆلیسترۆڵی باش ناسراوە و کارەکەی بریتی یە لەپاراستنی بۆرییەکانی خوێن لەکەڵەکەبوون و نیشتنی چەوری زیادە.

**دووەمیان بریتی یە لە جۆری" LDL"** ئەمیش بە کۆلیسترۆڵی خراپ ناسراوە چونکە لەناو شانە و ئۆرگانەکانی لەشدا دەنیشێت و زیانی گەورەی تەندروستی دەبێت. بۆ زانینی ڕێژەکانیشیان لەکاتی ئەنجامدانی شیکاری کۆلیسترۆڵی خوێندا هەردوو جۆرەکەی چەوری خوێن دەردەکەوێت.



## <u>جۆرەکانی چەوری و رێژەی ئاساییان ٠</u>

| Element | Optimal | Borderline | High risk |
| --- | --- | --- | --- |
| LDL C | <100 | 130–159 | 160+ |
| HDL C | >60 | 35–45 | <35 |
| Triglycerides | <150 | 150–199 | >200 |
| Total Choles. | <200 | 200–239 | >240 |

دەرمانەکانی چەوری بە گشتی دەبن بە سێ کۆمەلە ٠

**HMG-CoA-reductase-1**

گرووپی ( ستاتینەکان ) بەکاردێ بۆ کەم کردنەوەی چەوری ناو خوێن

تێبینی// دەرمانەکان بەگشتی وا باشترە شەوان بخورێ چونکە بەم شێوەیە چەوری زیاتر دادەبەزێ ٠

1_~(statin)

- Rosuvastatin
- Simvastatin
- Atorvastatin
- Lovastatin
- Paravastatin

**Fibrates.–2**

فایبرەیتەکان بەکاردێ بۆ کەم کردنەوەی چەوری( تراگلسراید)ـ

2_~ (fib rate)

- Fenofibrate
- Ciprofibrate
- Clofibrate
- Bezafibrate

**Omega-3,Maxepa,fish oil- 3**

کۆمەڵەی سێیەم ئەم کۆمەڵەیە زیاتر ئاستی چەوری( ترایگلسراید)کەم دەکەنەوە٠

# شەکرەAnti diabetic

**نەخۆشی شەکرە چیە ؟** لەم نەخۆشییەدا ڕێژەی گلوکۆزی خوێن بەرز دەبێتەوە، بە واتایەکی تر یان لەش ناتوانێ ئەنسۆلینی پێویست بۆ دابەزاندنی شەکری خوێن بەرهەم بهێنێت یان لەش لە بەرامبەر ئەنسۆلینەوە خۆڕاگری دەکا و بەم بۆنەوە ئەنسۆلین ناتوانێ کاری ئاسایی خۆی ڕاپەڕێنێ.
کە دەبێتە هۆی بەرزبونەوەی ڕێژەی شەکر لە خوێندا ، چارەسەری بنەبڕی نیە بەلام دەرمانەکانی ئەم نەخۆشیە نایەڵێ کێشەی تری بۆ دروست ببێ.

**سێ جۆری شەکرەمان هەیە**

**شەکرەی جۆری یەك** // زیاتر توشی مندال و هەرزەکار دەبێ بە هۆی سستی پەنکریاس لەدەردانی ئینسۆلین .
**شەکرەی جۆر دووەم** // زیاتر لە پێگەیشتوان ڕوودەدات لە ئەنجامی کەم دەردانی ئینسۆلین یاس سود وەر نەگرتن خانەکان لەناو ئەنسۆلین .
**شەکرەی جۆری سێ** // شەکرەی سکپڕیە کە خانەکان پێویستیان بە ئەنسۆلینە بۆ ئەوەی شەکرەکان بچنە ناو خانەکەو وەك سەرچاوەی وزە بەکاریان بێنن .




**نیشانەکانی**

ئارەق کردن ،زۆر میز کردن ، دەم وشکی ، درەنگ چاکبونی برین ، بێهێزی....

چارەسەری دەرمان

**جۆری یەکەم** //پشت دەبەستێت بە ئینسۆلین ٠
**جۆری دووەم**// شەکر کۆنترۆل دەکری لە ڕێگەی ڕژێمی خۆراکی تەندروست و وەرزشی تەندروست ، هەندێك جار دەبێ دەرمان بەکار بێ٠

- Metformin
- Glimepride
- Glibnclamid
- Gliclazide
- Tolbutamid
- Sitagliptin
- Vildagliptin
- Linagliptin
- Saxagliptin
- Pioglitazone
- Rosiglitazone
- Repaglinide
- Nateglinide
- Acarbose
- Miglitol
- Metformin+Glimpride (amary)
- Metformin+Glibnclamid(glucovance)
- Metformin+sitagliptin(Janument)

| Blood Glucose Chart | | | |
|---|---|---|---|
| Mg/DL | Fasting | After Eating | 2-3 hours After Eating |
| Normal | 80-100 | 170-200 | 120-140 |
| Impaired Glucose | 101-125 | 190-230 | 140-160 |
| Diabetic | 126 + | 220-300 | 200 + |



**تێبینی** // ئەوکەسانەی شەکرەیان دادەبەزی پێویستە بە بە خێرای شتێکی شیرین بخۆن یان دەبێ( گلوکۆس وۆتەر یان بۆ دابنرێ ٠

# Bronchodilator

جۆرێکە لە دەرمان کە هەناسەدان ئاسانتر دەکات بە هێورکردنەوەی ماسولکەکان لە سیەکان و فراوانکردنیڕێڕەوی هەوا . زۆر جار بەکاردێت بۆ چارەسەر کردنی هەلومەرجی درێژمەوەدا کە لەوانەیە ڕێڕەوی هەوا تەسک و هەوکردن بن، وەک: نەخۆشی ڕەبۆ کە حاڵەتێکی هاوبەشی سییەکان کە بەهۆی هەوکردنی ڕێڕەوی هەواکانەوە دروست دەبێت.




زیاتر بەکاردێن بۆ تەنگەنەفەسی و فراوانی بۆڕی هەوا و ڕەبۆ.

- Salbutamol
- Fenoterol
- Salmeterol
- Theophylline
- Aminophyllin
- Bromhexine
- Montelukast
- Beclomethasone

- ئاگاداربە لە بەکارهێنانی (سەلبوتامۆل) چونکە لێدانی دڵ خێرا دەکات زیاتر بە شێوازی بەخاخ دەدرێ

## دژە یالە پەستۆAnti depressant

**خەمۆکی** :نەخۆشیەکی میزاجیە کە دەتوانێت کاریگەری لەسەر ژیانی ڕۆژانەی کەسێک هەبێت. لەوانەیە وەک هەستێکی دڵتەنگی، دۆڕان، یان تووڕەیی وەسف بکرێت. خەمۆکی هەروەها لە ئافرەتدا زۆر باوترە لەگەڵ ئەوەشدا،
دژە خەمۆکیەکان هەڵبژاردنێکی چارەسەری بەناوبانگن بۆ خەمۆکی. هەرچەندە دژە خەمۆکیەکان لەوانەیە چارەسەری خەمۆکی نەکەن، بەڵام دەتوانن نیشانەکان کەم بکەنەوە.

تێبینی // ئەم دەرمانانە نابێ بێ دکتۆری پسپۆر بدرێ بە نە خۆش٠

**دەبن بە چەند گرووپێك**

### selective serotonin reuptake inhibitors (SSRIs)

ڕێگریکەرەکانی هەڵوەشانەوەی سەرۆتۆنینی هەڵبژێردراو (SSRIs) پۆلێک لە دەرمانەکانن کە زۆربەی جار بۆ چارەسەری خەمۆکی دەنوسرێن. زۆر جار وەک دەرمانسازیی هێڵی یەکەم بۆ خەمۆکی و چەندین نەخۆشی دەروونی تر بەکاردێن بەهۆی سەلامەتی و خۆڕاگرییان.

- sertraline (Zoloft)
- fluoxetine (Prozac, Sarafem)
- citalopram (Celexa)
- escitalopram (Lexapro)
- paroxetine (Paxil, Pexeva, Brisdelle)
- fluvoxamine (Luvox)

## serotonin and norepinephrine reuptake inhibitors (SNRIs)

یارمەتی باشترکردنی ئاستی( سیرۆتونین) و (نۆرپینەفرین )لە مێشکتدا. ئەمە لەوانەیە نیشانەکانی خەمۆکی کەم بکاتەوە.

- desvenlafaxine (Pristiq, Khedezla)
- duloxetine (Cymbalta)
- levomilnacipran (Fetzima)
- venlafaxine (Effexor XR)

## tricyclic antidepressants (TCAs)

زۆر جار دەنوسرێت کاتێک ئێس ئێس ئاڕ ئایەکان یان دژە خەمۆکیەکانی تر کار ناکەن.

- amitriptyline
- amoxapine
- clomipramine (Anafranil)
- desipramine (Norpramin)
- doxepin
- imipramine (Tofranil)
- nortriptyline (Pamelor)
- protriptyline
- trimipramine (Surmontil)

## Tetracyclic antidepressant

- Maprotiline

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی خەمۆکی و دڵەڕاوکێ. هەروەها کاردەکات بە هاوسەنگی گواستنەوەی دەمار بۆ ئاسانکردنی نیشانەکانی خەمۆکی.

## 5-HT1A receptor antagonist

دەرمانی ئەم پۆلە کە بۆ چارەسەری خەمۆکی بەکاردێت پێی دەوترێت vilazodone (ڤیبرید). ئەوە کاردەکات بە هاوسەنگی ئاستی سیرۆتۆنین و گواستنەوەی دەمارەکانی تر.

ئەم دەرمانە بەدەگمەن وەک چارەسەرێکی هێڵی یەکەم بۆ خەمۆکی بەکاردێت. ئەوە بەو مانایەیە کە ئەوە زۆربەی کات تەنها کاتێک دەوترێت کە دەرمانەکانی تر بۆ تۆ کار ناکەن یان کاریگەری خراپیان بۆ دروست کردووە.

## 5-HT2 receptor antagonists

- nefazodone
- trazodone

دوو ئەنتاگۆنیستی ٥-HT2ی وەرگر، نەفازودۆن و ترازودۆن (ئۆلپترۆ)، بۆ چارەسەری خەمۆکی بەکارهێنراون. ئەمە دەرمانی کۆنن. ئەوان کیمیایی لە مێشکت دەگۆڕن بۆ یارمەتیدانی خەمۆکی.

## 5-HT3 receptor antagonist

- vortioxetine

ڤۆرتیۆکستین (برینتێلیکس) ٥-HT3 وەرگری ئەنتاگۆنیست چارەسەری خەمۆکی دەکات بە کاریگەری لەسەر چالاکی کیمیای٠

## **شەقیقەMigrain headache**

زۆر جار مرۆڤ توشی ئازارێك دەبێت لە سەریدا، کە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە جیاوازە، کە یەکێك لەو جۆرانەی سەر ئێشە پێی دەڵێن شەقیقە و زۆربەی کاتیش لایەکی سەر دەگرێتەوە.

شەقیقە بریتیە لە سەرئێشەیەکی زۆرتوند، ئەم ئازارە بۆ ماوەی ٤ تا ٧٢ کاتژمێر بەردەوام دەبیت بە زۆری یەك لای سەری ئەگرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کەسەکە چاوی ئێش دەکات، ئەکرێت هەردوو لای سەری ئێش بکات، بەڵام بە زۆری یەك لای ئەگرێتەوە.



**نیشانەکانی دیکە، کە لەو کەسەدا دەردەکەوێت:**

.١ــ ڕشانەوەی و دڵ تێکهەڵاتن.

.٢ــ0هەستیاربوون بە ڕووناکی و دەنگە دەنگ و بۆن، واتە کەسەکە بە ڕووناکی یان دەنگە دەنگ یان بە بۆن زۆر بێزار ئەبێت.

**هاندەرەکانی دروست بوونی شەقیقە؟**

١ــ .گۆڕانی کەش هەوا و وەرزەکان

٢ــ .گۆڕانکاری لە هۆڕمۆناتدا

٣ــ .قەلەقی

٤ــ .کەم خەوی

٥ــ .ڕووناکی یان بۆنی زۆر بەهێز

**چارەسەرکردن:**

بە دوورکەوتنەوە لە هۆکارەکانی دروست بوونی ئازارەکەش نامێنێت یان کەم دەبێتەوە و دەکرێت دەرمانی ئازارشکێن بۆ هەندێك لە حاڵەتەکان بەکاربهێنرێت، بەڵام پێویستە سەرەتا سەردانی پزیشکی پسپۆڕ بکرێت تا لەڕێی پشکنینەکانەوە جۆری شەقیقەکە دیاری بکات و دەرمانی پێویست دیاری بکات.

Name ( triptan)

- zolmitriptan
- almotriptan
- frovatriptan
- naratriptan
- rizatriptan
- sumatriptan
- eletriptan

# مایەسیری

**مایەسیری بریتیە** لە لە هەوکردن و ئەستوربونی خوێن هێنەر لەبەشی خوارەوەی و کۆتای کۆم زۆر جار نەخۆشیەکەمەترسیدار نیە بەلام پێویستە چارەسەر بکرێ ٠




**نیشانەکانی چین ؟**

١ـ قەبزی زۆر و پیسایی ڕەق
٢ -خوێن لە کۆمەوە
٣ - بونی ئازار لە کۆم
٤- ئەستوربونی دەرچەی کۆم

**هۆکارەکانی چین ؟**

١ـــ زۆر دانیشتن یان بە پێوە وەستان
٢ـــ بۆماوەیی
٣ـــ قەڵەوی
٤ـــ قەبزی زۆور یاخود ڕاگرتنی پیسایی کاتێکی زۆور

چارەسەریەکانی چین ؟

١ـــ خواردنی ئاوی زۆر
٢ـــ سەوزە و میوەی زۆر بخۆیت
٣ـــ خۆ لاواز کردنەوە
٤ـــ وەرگرتنی دەرمان لای دکتۆری پسپۆر

- Proctoheal
- Procto glycerol
- Procto cinolon

# قۆلۆن

بریتیە لە نەخۆشیەکی درێژخایەنی کۆئەندامی هەرس،ئەوەندە باوە تەنانەت لە هەندێ وولآت ئەوە دیاریکراوە نزیکەی یەك لەسەر پێنجی خەڵکی ئەم نەخۆشیەیان هەیە، زیاتر لە ئافرەتان و پێش تەمەنی ٣٥ ساڵی سەر هەڵئەدات.

ـــــ هەرچەندە نەخۆشی قۆلون زیاتر نەخۆشیەکی نادیارە و هۆکارەکانی زۆر بەروون و ئاشکرایی نەدۆزراتەوە، بەڵام تێبینی هەندێ هۆکاری یارمەتیدەر کراوە کە مەترسی تووشبون بەو نەخۆشیە زیاتر دەکەن.

- کێشەی خێزانی یان بەهۆی دڵەڕاوکێ و سترێسێکی درێژ خایەن تووشی نەخۆشی قۆلۆن بوون،بۆیە خەم و خەفەت خواردن و کێشەی دەروونی بە یەکێك لە هۆکارە یارمەتیدەرەکان دادەنرێت.

- هەندێك لە نەخۆشانی تریش دوای هەوکردنی کۆئەندامی هەرس بە بەکتریا یان ڤایرۆس تووشی ئەم نەخۆشیە دەبن.
- هەستیاری هەندێ لە خەڵکی بەرامبەر بە هەندێ جۆری خواردن لەوانەیە نارەحەتیەکانی قولون بێنێت، ئەمە جگە لە ئەگەری تووشبونی ئەم نەخۆشیە لە هەندێ خێزاندا و لەو کەسانەی کە نە خۆشی گەنمیان هەیە.




## چارەسەری

بۆ کەمکردنەوەی نارەحەتیەکانی نەخۆشی قۆلون وا باشە نەخۆشە خۆی بەدوور بگرێ لەو جۆرە خواردنانەی کە غازات و سك ئاوسانەکەی زیاتر دەکەن، بە پێی تواناش خەم و خەفەت خواردن کەمکاتەوە، وە بۆ قەبزیەکەشی وا باشە خواردنی سەوزە و میوە کە دەوڵەمەندن بە ڕیشاڵەکان زیاتر کات وەکو خەیار و سێو و هەرمێ و کاهوو و نەعنا و ئاو خواردنەوە پزیشکی پسپۆر هەندێ چارەسەر بۆ کەمکردنەوەی ئازاری سك و قەبزی و سکچون دادەنێت، هەروەها دەرمانی دژی گرژبوونی ڕیخۆڵەکان و دەرمانی دژە خەمۆکی دادەنێت بۆ حاڵەتەکە.

# میکوتەChickenpox

بریتیە لە پەیدابونی زیپکە و بلق لەسەر ڕووی پێست ،نەخۆشیەکی درمیە ، بۆیە هەموو کەسێك ئەگەری توش بونی هەیە لە قۆناغی ژیانی ٠

یەکێکە لە نەخۆشیە گوازراوەکان کە ماوە ٢١ ڕۆژ دەخایەنێت هەفتەی ١،٢ دەگوازرێتەوە بەلام هەفتەی کۆتای ناگوازرێتەوە زیاتر لە ڕێگەی هەواوە دەگوازرێتەوە

**نیشانەکانی** // بێ تاقەتی و کەمی ئارەزووی خواردن و بەرزی پلەی گەرمی




تا ئێستا چارەسەرێکی بنەبڕ نیە بۆ ئەم نەخۆشیە بەلام لە ڕێگەی پێدانی هەندێ دەرمان دەتوانی لە نیشانەکانی کەمبکرێتەوە٠

**ئەو شتانەی دەدرێت بە نەخۆش**

- ئازار شکێنەکان __ وەك( پاراسیتۆل) بۆ دابەزاندی تایەکەی
- دژە بەکتریا ـــ( امۆکسیلی یان کیفلێکس)-
- حەساسی ــ( الرمین٠)شەوان
- لۆشن کرێم ــ چەورکردن

# **بالوكە و مێخەك**

**بالوكە**// دەرپەڕیوێكی شێوە بلوقە لەسەر ڕووی پێست هۆكارەكەشی بریتیەلە ڤایرۆسی
Human papilloma virus

**مێخەك**// بریتیە ئەستوربونێكی سنورداری شێوە قوچەكی كە بەشی سەرەوەی باریكەو ژێری بلاوە٠

چۆنیەتی جیاكردنەوەی بالوكە و مێخەك!!!!٠

١ــ كەمێك سەری هەلكۆلە ئەگەر وردیلەی سوری تێدابوو ئەوا بالوكەیە
ئەگەر تێدا نەبوو ئەوا مێخەكە٠
٢ ــ بالوكە دوو جۆری هەیە بالوكەی ڕەق لە لە بنە پێیەكان وپشتە دەست دێ
بالوكەی نەرم زیاتر لە نێوان پەنجەكان دێ ٠




**چارەسەر**

- لابردنی پەستان لەو شوێنە لەبەر نەكرنی پێلاوی تەسك
- لێدانی لەزگە و قەترە

تێبینی // بە ئاوی شلەتێن بیشوان  و ڕۆژی یەك جار ئەم قەترەی لێ دا٠
Salicylic acid

## لیر چیە ؟

کاردانەوەی الێرجیکی توشە کە بە شێوەی زیپکەی پانی سور دەردەکەوێ لەسەر پێست وە نەخۆشیەکی کورت خایەنە کە لەش سور دەبێتەوە و دەخورێ ٠



**چارەسەری**

- باشترین چارەسەر ناسینی هۆکارەکەی تی ٠
- خۆپاراستن لە چەرەز و بیبەر و هێلکە و مزرەمەنیەکان ٠
- زۆۆربەی کات بۆ هێورکردنەوەی لیر( ئەنتی هیستامین) دەدرێ بە نە خۆش ٠


Mohamad Rajab muhamadamin

# نەخۆشی ئێکزیما

یەکێکە لە نەخۆشییە بەر بڵاوەکانی پێست دادەنرێت. ئێکزیما لە ئەنجامی هەوکردنی پێستەوە دروست دەبێت. ئەم نەخۆشیە بە خوران، سووربوونەوەی پێست و دروست بوونی لیر و قڵیشان دەناسرێتەوە. ئێکزیما نەخۆشیەکی گوێزەرەوە نییە و کوشندەش نییە ئەگەر بێت و چارەسەری بکرێت و پشتگوێ نەخرێت. ئەم نەخۆشییە بە زۆری لە تەمەنی منداڵیدا بەر بڵاوە.

## هۆکارەکانی

- ماددەی وەرسکەر وەک سابون، شامپۆ و ماددە پاک کەرەوەکان بە گشتی و هەروەها گۆشت و سەوزە.
- زیندەوەری بچوک وەک بەکتریا و ڤایرۆس و کەڕوو.
- خواردن وەک بەر هەمەکانی شیر.
- گۆڕانی ڕێژەی هۆڕمۆن بە تایبەتی لە خانمانی دووگیان.
- ماددەی هەستیار وەک تۆز، ئاژەڵی ماڵی و کرێژی سەر.
- پلەی گەرمی زۆر بەرز یان زۆر نزم وە شێی بەرز و نزم و ئارەقە کردن.

## نیشانەکان

تووشبووانی ئێکزیما چەند نیشانەیەکیان تێدا بەدەر دەکەوێت لەوانە وشکبوونی پێست و هەستیاری، سووربوونی پێست و هەوکردنی، خورانی پێست، پەڵەی ڕەشی پێست هەروەها دەرکەوتنی شوێنی هەڵئاوساوی پێست.




## چارەسەری

ئەو چارەسەرییانەی کە لە نەخۆشی ئێکزیمادا بەکاردێت ئامانج لێی چاکبوونەوەی پێستی توشبوو و ڕێگریکردن لە زیادبوونی نیشانەکانە. هەندێک لە تووشبوان دەتوانن بە تێپەڕ بوونی کات چاکببنەوە، بەڵام هەندێکیان تا کۆتایی تەمەنیان لەگەڵ نەخۆشیەکە دەمێننەوە.

# نەخۆشی سەدەف

سەدەف نەخۆشیەکی پێستە کە دەبێتە هۆی سووربوون، خووران و قلیش بوونی پێست. ئەگەری ڕوودانی زۆرە لە ئەژنۆ، ئانیشک، بەشی خوارەوەی پشت و ناو سەر. سەدەف نەخۆشیەکی باو و درێژخایەنە و بێ چارەسەرە. ئەگەری نوێبوونەوەی هەیە، خراپ دەبێت بۆ چەند هەفتەیەک یان چەند مانگێک و پاشان بەرەو کەم بوون و باش بوون دەچێت. چارەسەر هەیە بۆ نەهێشتنی نیشانەکانی. دەتوانی ژیانی ئاسایی خۆت بەردەوام بی بە خۆ گونجاندن لەگەڵ چارەسەرکردنەکانی تاکو نەخۆشییەکە نەبێتە هۆکاری نارەحەتبوونت.

## جۆرەکانی سەدەف




**١ــ لەکەی سەدەف(Plaque Psoriasis)**: دیارترین جۆری سەدەف کە دەبێتە هۆکاری وشکبوون و ئەستووربوون و سووربوونەوەی پێست کە بە پارچەیەکی ڕەساسی ڕووپۆش کراوە. ئەگەری خوران و هەستیار بوونی پێستی هەیە، هەندێک کات کەمە بەڵام هەندێک کاتیش زۆرە. زۆرجار لە ئانیشک، ئەژنۆ، خوارەوەی پشت و ناو سەر بەدەردەکەون.

**٢ـ سەدەفی نینۆک(Nail Psoriasis)**: کاریگەری لەسەر نینۆکەکانی پەنجەی دەست و پێ هەیە. کارگەری دەکاتە سەر درێژبوونی نینۆک و دەبێتە هۆکاری تێکچوونی. هەروەها ئەگەری جیابوونەوەی نینۆک هەیە لە شوێنی خۆی، وە هەندێک جار دەبێتە هۆی شکان و پارچە بوونی نینۆک.

**٣ـپەڵەی سوور(Guattate Psoriasis)**: بەتایبەتی کاریگەری لەسەر منداڵان هەیە بە هەوکردنی بەکتریا دەست پێ دەکات بۆ نموونە ئەستوور بوونی لوزتین. وەکو دڵۆپ دڵۆپی سوور بە جەستەدا بڵاو دەبێتەوە بەتایبەتی لە قوڵ، قاچ و خوارەوەی جەستە.

**٤ـ ئینڤێرس((Inverse Psoriasis:** زۆر زیاتر کاریگەری لە بەشی ژێرەوەی مەمک و ناو لاق هەیە. پەڵە سوورەکانی لووسن و هۆکارەکەشی ئارەقە و لێکخشانە، هەروەها (فطریات)یش دەبێتە هۆی ئەم نەخۆشیە.

**٥ــ پووستولەر((Pustular Psoriasis:** سەدەفێکی دەگمەنە دەبێتە هۆکاری (إلتهاب)ی پێست و دروست بوونی پەڵەی وەکو زیپکە کە رەنگیان زەردە. لە ناو لەپی دەست یان ژێر پێ روودەدەن.

**٦ــ ئێریثرۆدێرمیک(:(Erythrodermic Psoriasis**کەمترین جۆری سەدەفە. ئەو کەسەی هەیبێت هەموو لاشەی دادەگرێت و دەبێتە هۆی خورانی زۆر، سوور بوون و سووتانی پێست.

**٧ــ سەدەفی جومگەکان((Psoriatic Arthritis:** دەبێتە هۆی ئەستوور بوون و ژانی زۆر لۆ جومگەکانی لەشی مرۆڤ کە ئەمەش یەکێکە لە إلتهاب المفاصل. هەندێک جار یەکەم نیشانەی سەدەف لە جومگەکان بەدیاردەکەوێت و لەو کاتەشدا گۆڕان لە نینۆکەکان روودەدەن. نیشانەکان لە کەمەوە بەرەو زیادبوون دەڕۆن و بەم جۆرەش کاریگەری زۆر دەکاتە سەر جومگەکان کە دەبێتە

هۆکاری تێکچوونی جومگەکان.



## چارەسەری نەخۆشی سەدەف

ئامانجی چارەسەرکردنی نەخۆشی سەدەف بریتیە لە ڕاگرتنی زیادبوونی خانەکانی جەستەی مرۆڤ کە زۆر بە خێرایی لە زیادبووندان لە کاتی ئەم نەخۆشیە.

### چارەسەری سەرپێست

بریتیە لە بەکارهێنانی کرێم، شامپۆ، مەرهەم، ڤیتامین D... هتد کە چەندی تریشن. ئەم چارەسەرانە بە گوێرەی جۆری نەخۆشیەکە دەگۆڕێن و بەردەستن.

### چارەسەری بە رووناکی و تیشک

یەکەم چارەسەری پێشکەوتووی نەخۆشیە جۆراوجۆرەکانی سەدەف، نەخۆش چ بە تەنها ئەو چارەسەرە وەربگرێت چ ئەو چارەسەرە لەگەڵ دەرمان وەربگرێت، کاریگاری باشی هەیە. تیشکی سروشتی و دەستکرد بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی سەدەف. نەخۆشەکە دەبێت بەردەوام بێت لە چارەسەر وەرگرتنی و دەشتوانێت لە پزیشکیش بپرسێت کە ئایا دەتوانێت لە ماڵەوە ئەم جۆرە چارەسەرە وەربگرێت. چارەسەرەکانی وەکو (تیشکی خۆر) کە سروشتیە و (لێزەر) کە دەستکردە.

### چارەسەری زارەکی و دەرزی و دەرمان

ئەگەر هەموو جۆرە چارەسەر و دەرمانەکانی تر بۆ ئەم نەخۆشیە وەرگیرا بەڵام کاریگەریەکی ئەوتۆی نەبوو. ئەوا پزیشکەکان ئەم ڕێییە هەڵدەبژێرن بۆ چارەسەر. بە هۆی ئەوەی کە کاریگەریەکی زۆری هەیە، ئەوا هەندێکیان بۆ ماوەیەکی کورت بەکاردێن و هەندێکیشیان دەگۆڕدرێن بۆ جۆری دەرمانی تر.

### چارەسەری سروشتی

هەندێک لە جۆری چارەسەرە سروشتیەکان یارمەتیدەرن بۆ نەهێشتنی نیشانەکانی نەخۆشی سەدەف وەکو ڕێجیمی تایبەت، کرێمی سروشتی، خۆراکە بەهێزکەرەکان و هەروەها گژ و گیاکان. هیچ کام لەمانە بە بەڵگە نەسەلمێندراوە کە کاریگەریان هەیە، بەڵام هەندێکیان زۆر سەلامەتن و دەبنە هۆی نەهێشتنی خووران و نەهێشتنی تۆشکە. چارەسەرە سروشتیەکان بریتین لە: کرێمی ئەلۆڤێرا، رۆنی ماسی، باربێری (رووەکێکی زەردی درکاویە) و رۆنی ئەسێنشڵ کە لە ئەرۆماوە هاتووە. پێش بەکارهێنانی هەر دەرمانێکی سروشتی وا باشترە کە پزیشک ئاگادار بکرێتەوە چونکە ئەو دەتوانێت ڕێژەی بەکارهێنانەکەت بۆ دیاری بکات.

## دەردە ڕێوی

دەردە ڕێوی، حاڵەتێکە تێیدا مووی لەش (بەتایبەتی قژی سەر) هەڵدەوەرێت. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا تووشی چەند ناوچەیەکی دیاریکراوی پێستی سەر یان لەش دەبێت و ئەو ناوچە دیاریکراوانە کەچەڵ دەکات. لە ١-٢%ی حاڵەتەکاندا هەموو پێستی سەر کەچەڵ دەکات. لە ژمارەیەکی کەمتری تووشبووواندا هەموو مووی لەش هەڵدەوەرێت. ١ تا ٢ لە هەزاری خەڵکی بە پیاو و ئافرەتەوە تووشی ئەو دەردە دەبن دەبن، بەڵام لە ئافرەتاندا بڵاوترە.



**هۆیەکانی**

- بۆماوەیی: هەبوونی خزمی نزیکی تووشبوو ئەگەری تووشبوون زیاتر دەکات.

- پەیوەندی هەیە لەگەڵ تێکچوونی کۆئەندامی بەرگری، بەجۆرێك کۆئەندامی بەرگری ئەو کەسە بە هەڵە هێرش دەکاتە سەر چیکڵدانەکانی موو و گەشەی موو دەوەستێنێ و هەڵی دەوەرێنێ.

**چارەسەر**

٥٠%ی تووشبووان بێ ئەوەی چارەسەری وەربگرن لە ماوەی ساڵێکدا مووەکەیان دێتەوە. ٩٠%ی حاڵەتەکان لە کۆتاییدا موویان دێتەوە. ئەو ١٠%یەی دەمێنێتەوە، هەرگیز مووەکانیان نایەتەوە.

ئەگەر حاڵەتەکە توند بوو، پزیشك لە شێوەی کرێم یان دەرزیدا ماددەی ستیرۆید دەداتە نەخۆش، هەندێجار ماددەی مینۆکسیدیلت دەدرێتە تووشبوو، کە یارمەتی بەهێزبوونی قژ دەدات، لە هەندێ حاڵەتی دیکەدا ماددەی دابەزاندنی بەرگری لەش دەدرێت تا هێرشی کۆئەندامی بەرگری بۆ سەر چیکڵدانەکانی موو لاواز بکرێت یان بووەستێنرێت.

# تحامیل suppositor

شاف مادەیەکی ڕەقە بەپێی جۆری ئەو دەرمانەی دەگۆڕێت ، بەزۆری پێك دێت لە جۆرێك ڕۆنی ڕوەکی و دەرمانی پزیشکی لە ناو ڕۆنە بەستوەکەدا ، کاتێك شاف لە ڕێگەی کۆمەوە هەڵدەگیرێت پلەی گەرمی لەش هەڵدەستێ بە تواندنەوەی ڕۆنەکە بەمەش دەرمانەکە بلاودەبێتەوە لەبەشی خوارەوەی ڕیخۆلە و هەڵدەمژرێ بۆ ناو سوڕی خوێن ٠

## نمونەی تحامیلی

## پاراسیتۆل

- بۆ تا و ئازار وژان لەسەر
- ١٢٥ ملگ بۆ مندالی خوار سال و نیو
- ٢٥٠ ملگ بۆ مندالی سەروو دوو سال تا دوازدە کاتی پێویست






**دیکلۆفیناك**

- تا و ئازاری لەش
- ١٢٠٥ ملگ بۆ مندالی هەشت مانگ تا دووسال ڕۆژی دووجار
- ٢٥ ملگ بۆمندالی دوو تا دوازدە سالی ڕۆژی دوو جار
- ١٠٠ملگ بۆ گەوران تەنیا شەوان




**قەبزی**

- بۆ چارەسەری قەبزی

- گلای سیرین  خوار دوو سالی
- بیساکۆدلی سەرووی دووسالی






## رشانەوە

- مۆتیلیۆم ١٠و٣٠ ملگ بۆ مندال
- مۆتیلیۆم ٦٠ ملگ بۆ گەوران




## مایەسیری

- Proctoheal
- Procto glycerol
- Procto cinolon









تێبینی // گرنگترین شت کە تۆ بیزانی زانینی ئەم دەرمانانەیە بۆ ئافرەتی دوگیان بەپێی ڕێنمایی دکتۆر .

<u>سەلامەتترین دەرمان بۆ ئافرەتی دووگیان</u>

١ــ بۆ ئازار شکێن ــــ پاراسیتۆل.
٢ــ بۆ حەساسیەت ــــ ستریزین و لیڤۆستریزین.
٣ــ بۆ کۆخە ــــ ئەو شروبانەی ماددەی سروشتیان تێدایە( پرۆسپان)-
٤ــ بۆ دل هەلچون و ڕشانەوە ــــ ڤیتامین بی ٦
٥ ــــ بۆ مەعیدە ــــ اومیپرازۆل.
٦ ــ بۆ قەبزی ــــ شروبی لاکتولۆس.
٧ ــ بەرزە پەستان ــــ مەثلي دوبا.
٨ ــ شەکرەی دووگیانی ــــ انسولین





















## **جۆرەکانی مغەزی**

١ ــ **نۆرمەل سەلاین** ــ بەکاردێ بۆ بەرزکردنەوەی زەخت ،پاکردنەوەی برین ،

٢ ــ **گلوکۆس سەلاین** ــ بەکاردێ بۆ بەرزکردنەوەی زەخت و وەك تەعویزێك بەکاردەهێنرێ ٠

٣ ــ **گلوکۆس وۆتەر** ــ بەکاردێ بۆ بەرز کردنەوەی شەکر لە خوێن ــ واتە ئەو کەسانەی کە شەکرەیان دابەزیوە ٠

٤ ــ **ڕینگەر** ـــ مادە ئەلیکترۆلایتی تێدایە  وەك تەحویزکردنەوە بەکاردێ کە بەهۆی سکچونەوە لەدەستی داوە ، ئەمە زۆور سەلامەتە بۆ ئەو کەسانەی کە زەختیان هەیە یان شەکرە بەلام بۆ ئەو کەسانە نابێ کە مادەی ئەلیکترۆلایتی زۆر بۆ ٠

٥ــ **فلاجیل بوتل** ــ بەکاردێ بۆ سکچون کە بەهۆی بەکتریا وە بێ٠



# چارەسەری بەرزە پەستان

نەخۆشی بەرزە پەستان یەکێکە لە نە خۆشیە کوشندەکان لەم سەردەمەو لە ئێستادا زۆر بلاوە ئەو کەسانەی بەردەوام زەختیان بەرزە دەبێ سەردانی پزیشکی پسپۆر بکەن بۆ چارەسەری٠

**لەم حالەتە پەرستار پێویستە چی بکات ؟**

١ــ ئارامکردنەوەی نەخۆش و دانانی لە شوێنێکی تەندرووست
٢ ــ دانانی کانۆلا٠
٣ــ دانانی( پاراستۆل بوتل) بۆ دابەزاندنی بەرزە پەستان ٠
٤ ــ دانانی مغەزی جا چ( ڕینگەر) بێ یان( گلوکۆس وۆتەر) بەلام بۆکەسێك نابێ گلوکۆس وۆتەر دانێی کە نەخۆشی شەکرەی هەبێ٠
٥ ــ دانانی دەرزی( لایزیکس) کە وەك میز پێکەر کاردەکات بۆ نزمبونەوەی بەرزە پەستان ٠

ـــــ ئەم هەنگاوانە پێویستە بە قۆناغ جێ بەجێ بکرێ تا زەختی دادەبەزێ ٠ ڕێژەی ئاسای {٨/١٢} ٠

**نیشانەکانی** // بریتیە لە ــ ژان لەسەر و ماندووبونی زۆر و کێشە لە بینین وئازاری سنگ ولێدانی ناڕێکی دل ٠٠٠٠

# دوورینەوە

بریتیە لە دوورینەوەی شانەکانی لەش کە بە هۆی بەرکەوتنی شتیکی تیژ یاخوت رووداوێک پێست توشی برین دەبێت بۆ چاک بونەوەی ئەو برینە دەبیت کرداری دورینەوە ئەنجام بدەین بۆ ئەوەی پێستەکە زووتر چاک ببێتەوە و شوینەکەی کەمتر دیار بمێنێتەوە لەسەر لەش٠

**ئامانجمان چیە لە دوورینەوە؟**

١ ــ خێرا چاکبونەوەی برین ٠
٢ ــ گەیاندنی هەردوو بەشە لێك جیابوەکە ٠
٣ ــ بۆ توش نەبوون بە هەوکردن ٠

**چەند جۆر خێتمان هەیە هەیە ؟**

**یەکەم** جۆرێپێی دەوترێت (**Absorabale** )ئەم جۆرە خێتانە دوای دورینەوە دەرناهێنرێت بەڵکو خۆی شیدەبێتەوە و دەتوێتەوە لە گۆشتدا.




**دووەم** جۆر پێی دەوتریت (**Non absorabale** )ئەم جۆرەیان دوای دورینەوە دەبیت دەربهێنرێت و توانای توانەوەیان نیە لە گۆشیدا.



**قەبارەی_خێتەکان**

(٠-١ ) (٠ـ٢)بۆ ڕووی قول و ماسولکە٠
(٠ـــ٣ )   بۆ سەر و قەد ودەستەکان ٠
(٠ـــ٤ )  پەلی سەرەوە و خوارەوە ٠
(٠ـــ٥ )دەمووچاو ٠
(٠ـــ٦) جوانکاری.

**ماوەی مانەوەی خێتەکان**

١ــ سەر ٧ ڕۆژ
٢ـ ڕووخسار ٥ ڕۆژ
٣ــ مل ٦ ڕۆژ
٤ــ سك و تەنیشتەکان ٩ ڕۆژ
٥ــ پەلەکان  ٨ بۆ ١٤ ڕۆژ

**پێداویستەکانی چین؟**

مادده  پاککەرەوە ، گۆز ،بەنج ، نۆرمەل سەلاین ، سیزەر ، نیدل هۆلدەر ، فۆرسێپس ، خێتی دوورینەوە٠(

چۆنیتی ئەنجامدانی کرداری دورینەوە

١.ئامادەکردنی پیداویستیەکان
٢.دەست شۆردن
٣دەستکیش لەدەست کردن
٤.خۆناساندن بە نەخۆش و رونکردنەوەی کردارەکە
٥.پاک کردنەوەی برینەکە.
٦.ئەگەر خوین بەربونی هەبوو خوین بەربونەکە دەبیت بوەستینرێت.
٧.جێڵی سرکەر لە برینەکە دەدەیت یان بە دەرزی بەنجی دەکەیت بەلام ئەگەر دەم و چاو بوو باش وایە بەنج بەکار نەهێنن.
٨.پاشان بە نیدل هۆلدەرەکە دەرزیەکە دەگرین وە بە فۆرسێپسەکە لێواری برینەکە بەرز دەکەینەوە و دورینەوەکە ئەنجام دەدەین.

پاش ئەنجام دانی ئەم پرۆسەیە پێویستە چارەسەری بۆ دابنرێ بۆ دژە هەوکردن  بۆ ئەوەی توشی التیهابات نەبێ وە ئازار شکێن بۆ کەم کردنەوەی ئازارەکەی ٠

- (Keflex)&(cefixim)دوو باشترین دژە بەکتریا کە لەم بارە بدرێ
- (Paracetamol)وەك ئازار شکێن

# **چارسەری سوتان**

**سوتان** // بریتیە لە تێکچونی یان لە ناو چونی پێست بەهۆی گەرمیەکی زۆر کە بەهۆی گەرمی یان تیشك یان ماددەی کیمیای پەیدادەبێت .

**جۆرەکانی سوتانی پێست:**

بەپێی سوتانی چینەکانی پێست دەکرێت بە سێ جۆر:

**١ــ پلەی یەکەم** //تەنها بەشی دەرەوەی پێست چینێکی تەنکە لە چەند ڕیزێکی خانەی پێست پێکهاتووە (وەکو سوربوونەوە بەهۆی تیشکی خۆر) کە دوش گرتن بە ئاوێکی سارد باشترین چارەسەرە.

**٢ــ پلەی دووەم :**//کە هەردوو چینی دەرەوەو ناوەڕاستی پێست دەسوتێت وە دەبێتە هۆی سوربوونەوە، لاچوونی چینی دەرەوەو دروست بوونی تەڕی و بڵقی ئاو کە ئەم جۆرە زۆر بە ئازارە.

**٣ــ پلەی سێیەم** //کە هەر سێ چینەکانی پێست (دەرەوە، ناوەڕاست، ژێرەوە) ی پێست دەگرێتەوە وە ڕەنگی لە نێوان سپی و قاوەیی دەبێت وە ئازاری نیە یا کەمە.



## چارەسەری

- سارد کردنەوەی شوێنی سوتانی پێست بە ئاوێکی ساردو بەخوڕ ٠
- لێدانی کرێمی دژە میکرۆب لە شوێنی سوتان.
- ئەگەر ڕێژەی سوتان زۆر بوو دەبێ ڕەوانەی نەخۆشخانە بکرێ٠

First & second

- fucidin cream
- Gentamicin
- amikacin
- betamethasone cream




Therd

- Flamazine

T.B/ (Zinc) If a wound have inflammation ‘can use .



# خوێن بەربونی لوت

خوێن بەربوونی لوت واتە بەربونی دەمارەکانی خوێن لەناو لوتەوە ئەوکاتەی کەسێک توشی ئەم حاڵەتە دەبێت ڕێژەیەکی زۆر خوێن لە دەست دەدات .

**هۆکارەکانی:**

١ــ ووشکبوونی لووت
٢ــ بەرکەوتنی زەبرێک بەلوت
٣ــ بەکارهێنانی هەندێک دەرمان وەک ئەسپرین.
-٤ــبوونی برین.
٥ــ هەستیاری..
٦ــ بەرزبونەوەی پەستانی خوێن.

**چارەسەری**

- ماوەیەک بوەستە و سەرت بۆ پێشەوە بهێنە پاشان بەپەنجەکانت کونی لوتت دابخە.
- - بەکارهێنانی پارچەیەک سەهۆڵ بۆ سەر لوت و ڕومەتت ئەمەش یارمەتی وەستانی خوێن دەدەدات لەدەمارەکاندا.
- - گرتنی لوتت بۆ ماوەی دەخولەک، پاش دەخولەک لووتت بەردە گەر زانیت دیسانەوە خوێن بەربوونت هەیە دوبارە لوتت بگرەوە تا ئەوکاتی خوێن بەربونەکەت دەوەستێت.
- دەتوانی ئەمپولی (کالیسیۆم١ )بکەیتە سەر لۆکەکە پاشان ناو کونی لوت دایبنێی بۆ چەند خولەکێك٠



# ئەوکەسانەی دوویشك یان مار پێیان وەدەدات

وەك فریاگوزاری سەرەتای پێویستە ئەم هەنگاوانە ئەنجام بدەی تا دەچێتە شوێنی مەبەست ٠

Fang marks

**1.** Apply a broad pressure bandage from below upwards and over the bite site as soon as possible. Do not remove trousers, as the movement of doing so will assist venom to enter the blood stream. Keep the bitten leg still

**2.** The bandage should be as tight as you would apply to a sprained ankle. The patient should avoid any unnecessary movements

**3.** Extend the bandages as high as possible

**4.** Apply a splint to the leg, immobilising joints either side of the bite

**5.** Bind it firmly to as much of the leg as possible. Walking should be restricted

**6.** Bites on the hand and forearm: **a** bind to elbow, **b** use splint to elbow, and **c** use sling

١ ـــ دوور خستنەوەی لە شوێنی مەترسیدار و لابردنی سترێس و قەلەقی
٢ ـــ دانانی کانۆلا
٣ ـــ لێدانی دەرزی( هایدرۆکۆرتیزۆن )پاش ٥ دەقە ئینجا( الرمینی )لێ بدە
٤ ـــ ئەگەر زەختی دابەزی نۆرمەل سەلاینی بۆ دانێ
٥ ـــ ئەگەر ژانی هە بوو( پاراستۆل بوتلی )بۆ دانێ وە دەبێ ڕەوانەی طواري بکرێ بۆ ئەوەی (ئەنتی گوزازی )لێ بدرێ ٠

تێبینی // ئەگەر دوویشك وماری ڕەش بێ یان ژانی نەشکابێ دەبێ ڕەوانەی نەخۆشخانە بکرێ ئەبێ( ئەنتی گوزازی) لێ بدرێ٠

